

# پێشەکی

اللهم علمنا ما ينفعنا، وانفعنا بما علمتنا، وزدنا علما "سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ.

سوپاس بوو وی خودایێ ئەم داین بسلمان و قورئان ب رەحماخو بۆ مە ئیناتیە خار

{الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجًا۩} [الكهف: ١]

ئانکو:حەمد هەمی بۆ خودایی بن، ئەوێ ژ کەرەما خۆ قورئان بۆ بەنییێ خۆ وپێغەمبەرێ خۆ موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- ئینایە خوارێ، ووی چو مەیلدارییا ژ حەقییێ نەکرییە تێدا.

قوران ئەو گەنجینەیە یاکو ل هەمی کاودانادا دگەل مرۆڤی دگونجیت، هەر کەسێ خۆ دا بەر سیبەرا قورانێ دێ گەلەک ژیان لبەر ب ساناهی بیت.

هەر گاڤا دل طەنگ بوون چ تشت نینە ڕۆناهیێ و خوشیێ و هیڤی و ئومێدا لێ بزفرینت ژبلێ گۆتنێت چێکەرێ وی، دڤێ پەرتوکێدامە ڤیایە ل سەر صەبر گرتنێ چەندەکێ بنڤیسین و چەندین ئایەتێن قورانا پیروز ل سەر ڤی بابەتی دڤێ پەرتوکێدا



خرڤە کەین بوو هندێ لدەمێ دکەڤیە بەرطەنگیەکێ بهێ و لڤان پەیڤاندا و بڤان ئایەتان دلێ خۆ تەنا بکەی، خودێ بکەتە د میزانا خێرێت مەدا و ب خۆ ڤی کاری حساب بکەت.



# صەبر

صەبر کێشان ئێک ژوان ئەگەرایە یت خودانێ خۆ دبەتە بەهەشتێ و هەر چ خێر و بەرەکەتا ددونیایێ دا ب حەلالی دگەهیتە خودانێ صەبر کێشانێ، خوشیا ڤی تەمەنێ کورتێ مروڤی هەی د دونیایێ دا هندی وێ صەبر کێشانێ یە یا مرۆڤی هەی، دونیا جهێ ئەزمونێ یە و ئەگەر ماموستایێ مرۆڤی دیت مرۆڤ یێ زیرەکە و یێ پێگیرە ب ڕێنمایت وی داین لدەمێ ئەزمونەکێ ب قوتابیێ خۆ دکەت دێ ل وێ ئەزمونێ پرسیارێت گەلەک زەحمەت بوو قوتابیێ خۆ دانیت دا ژ راستا ئاستێ زیرەکیا وی ببینیت و ئەگەر خەلاتەک مەزن ل پشت ڤێ ئەزمونێ رابیت نە یا بەر عاقلە ماموستا بوو زانینا ئاستێ زیرەکیا قوتابیێ خۆ پرسیارێت ب ساناهی ب دانیت و بساناهی ئەڤ قوتابی ڤی خەلاتێ ببها بدەست خۆ ڤە بینیت چنکو دێ هەمی پێکڤە بنە خودانێت وی خەلاتێ بهاگران لەوا زیرەک و کسلان دێ ل ئێک ئاستی و ب ئێک خەلاتی هێنە خەلات کرن یێ خۆ ماندی کری و یێ خۆ ماندی نە کری دێ بساناهی دەرباز بن و ئێک خەلات وەر گرن ئەڤە ژی نە دادپەروەریە، پا ئەگەر ئەڤە دونیا بیت و خودایێ مە ئەم بوو ئەزمونەکێ دابیت و ئەم دزانین هەر کار و کریارێت مە



ل ڤێ دونیایێ دا ڕوژەک دێ هێت و دێ حسابا مە لسە هێتە کرن کا چ د پەرتوکێت مە دا هاتیە نفیسین ڕوژەکێ دێ ل بەرانبەر خودێ راوستین و ئەڤ پەرتوکە پەیڤ پەیڤ چ ژێ کێم نینە و تەرازیا خودێ داناتیە کیژ مە یە دشێت ل دونیایێ دا پەرتوکێت خۆ پر بکەت ب خێرێ و ذکری و تاعەتی ئەگەر وەلیە کێ خودێ نەبیت، باشە ئەگەر خودێ موسیبەتا نەدە تە مە ل دونیایێ و ڤان ئەزمونیت ب زەحمەت نە ینت ڕێکامە و ئەم ب صەبر گرتنێ ل سەر ڤان نەخوشیا بهناخو ڤرەهنەکەین دێ چەوا ئەڤ هند خێرە بدەست مە کەڤن کو مە ژ هەژی چونا بەهەشتێ بکەن و ژ هەژی بلند بونا پلەیت بلندێت بەهەشتێ بین، هەر نەخوشیەکا د هێتە ڕێکامە هە چ بیت مرنا خوشتڤیا بیت هەژاری بیت نەخوشیت دوم درێژبن. . . هتد. . ، تو بزانە ئەڤە هەمی دەلیڤەنە بووتە دا بگەهیە وێ پلەیێ یا ژ هەمیا بلند تر یا تو نەشێ ب عەمەلێ خۆ بگەهیێ دێ ب صەبر گرتناخو گەهیێ ئەڤجا هەر گاڤا نەخوشیەک بووتە چێ بوو تو بزانە ئەو ئەزمونا خودایێ تە یە بووتە و حەژ تە دکەت لەوا ئەڤ موصیبەتە بسەر تە دا ئینات داکو صەبر گرتناتە بجەربینیت، هەر تشت ژ دەڤ خودێ یە و هەر تشت دێ ب ئەمرێ ویە.



"عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ كُنْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا فَقَالَ: يَا غُلَامُ إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ احْفَظْ اللَّهَ يَحْفَظْكَ احْفَظْ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلْ اللَّهَ وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَاعْلَمْ أَنَّ الْأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَكَ وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْكَ رُفِعَتْ الْأَقْلَامُ وَجَفَّتْ الصُّحُف.[1]"

"کورێ عەباسی(رازیبونا خودێ لێ بیت) دبێژیت: د ڕوژەکێ دا ئەز ل پشت پێغەمبەری بووم (صل لله علی وسلم) گوت:"ئەی گەنجو، ئەزدێ هندەک پەیڤا نیشاتە دەم، سنورێت خودێ بپارێزە دێ خودێ ژی تە پارێزیت، سنورێت خودێ بپارێزە دێ خودێ بیتە پشتەڤان بۆ تە ، ئەگەر تە داخوازیەک هەبیت ژ خودێ بخوەزە، و ئەگەر تە هاریکاریەک دڤێت دعا ژ خودێ بکە خودێ ببیتە هاریکارێ تە، و بزانە ئەگەر ئومەت هەمی کومبوون دا تشتەکێ مفای بگەهیننە تە نەشێن چ مفای بگەهیننە تە ئیللا ئەو تشت نەبیت ئەوێ خودێ بۆتە نڤیسی، و ئەگەر کومبوون دا زیانێ بگەهیننە تە نەشێن چ زیانێ بگەهیننە تە ئیللا ئەو تشت

(1) رواه الترمذي (2516)



نەبیت ئەوێ خودێ بۆ تە نڤیسی، قەدەر هاتینە نڤێسین و ناهێتە گوهورین"

یا بووتە هاتیە نڤیسین دێ هێتە ڕێکاتە ئەڤ جا صەبر گرتنا تە دێ پلاتە بلند کەت و تە ژ هەژی چونا بەهەشتێ کەت، و دژی ڤێ لدەمێ بەلا و موصیبەتا ئەگەر تە صەبر نە کێشا و تو رازی نەبووی ب ئەمرێ خودێ دێ ئەڤ چەندە تە بەرەڤ نەڤیانا خودێ ڤە بەت هەتا تە ژ هەژی چونا دوزەخێ ژی کەت، وەک گەلەک کەسا لدەمێ موصیبەتا مرنێ دگەهیتە وان ئەو کوفریان دکەن و ژن جلێت خۆ لبەر خودا د قەتینن، و ب هیچ ڕەنگەکێ گۆتنەکا خێرێ ل بیرا وان نامینت و شەیتان دبیتە باشترین هەڤالێ وان ل ڤان دەماندا، ئەڤە نە ئەوێن خودێ ئاگرێ دوزەخێ ب وان خوش دکەت.

صەبر کێشان دەرگەهەکە بوو گەهشتن و بدەست ڤە ئینانا هەر چ یا خێرا دونیا و ئاخرەتا مرۆڤی تێدا. تەعلاتیەک دژوارە بەلێ شرینیەک بێ سنور و جوان یال پشت خۆ هەلگرتی دێ هنگێ وێ شرینیێ بینی هەتا تو باش تام دکەیە تەعلاتیا چاڤەرێ بوونێ، خودانێ صەبر گرتنێ چ جارا خوسارەت نابیت ئەگەر عەمرێ وی خلاس و بەرهەمێ صەبر گرتنا خۆ نەدیت ل دونیایێ خودێ



بباشترین خەلات دێ وی خەلات کەت ل ڕوژا قیامەتێ. صەبر کێشان کارێ پێغەمبەرا بوو و ئەوان صەبر کێشا ل سەر هەمی نەخوشیا و نەخوشیا کەسێ هندی یاوان مەزن نەبوو و ئەو خوشتڤیت خودێ بوون لوا بزانە ئەگەر خودێ تو ڤیای دێ تە ب صەبر کێشاناتە ئەزمن کەت خۆزیت وی یێ ژڤێ ئەزمونێ دەرباز ببیت ب حەمد و شوکر و رازیبونا ژ خودێ و قەدەرا وی. دا پێکڤە بهایێ کەسێ صەبر کێش ببینین کا خودێ چەند ب مەزنی بەحس ل کەسێت صەبر کێش کریە و چەند خەلاتەک مەزن ل دونیا و ئاخرەتێ ل پێشیا وان دانابیە، ئەو ئایەتێت بەحس ل صەبر کێشییێ دکەن د قورانا پیروز دا ئەڤێت ل خوارێ نە.

{وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَ ٰلِكَ لَمِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ} [الشورى:٤٣]

هەچییێ صەبرێ ل سەر نەخۆشییێ بکێشت وخڕابییێ ڤەشێرت، هندی ئەو چەندەیە ئەو ژ کارێن موکمە یێن مەدحێن خودانی سەرا دئێنەکرن ویێن خودێ فەرمان پێ کری، وخێرەکا مەزن بۆ دانای.

کەسێ هندی پێغەمبەرێت خودێ نەخوشی نەدیتنە و ئەو خوشتڤیت خودێ بوون ئەگەر ئەڤرۆکە لدەوروبەرێت مە هندەک کەس هەبن ب گۆتن و کریارێت خۆ دلێ مە تژی بکەن



پێغەمبەرێت خودێ مللەتەک دژی وان دراوستا بەلێ بصەبر گرتنێ ئەو حەقی بسەر کەڤت یا خودێ ڤیای

{فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسۡتَعۡجِل لَّهُمۡۚ كَأَنَّهُمۡ يَوۡمَ يَرَوۡنَ مَا يُوعَدُونَ لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةٗ مِّن نَّهَارِۭۚ بَلَٰغٞۚ فَهَلۡ يُهۡلَكُ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ } [الأحقاف:35]

ڤێجا تو -ئەی پێغەمبەر- بێهنا خۆ فرەهـ بکە ل سەر وێ نەخۆشییا ژ مللەتێ تە یێ کافر دگەهتە تە، هەر وەکی پێغەمبەرێن خودان عەزم بەری تە صەبر کێشای -وئەو پێغەمبەر نووح وئیبراهیم ومووسا وعیسانە، وتو ژی ژ وانی- وتو لەزێ د عەزابدانا مللەتێ خۆ دا نەکە؛ چونکی دەمێ عەزاب دئێت وئەو وێ دبینن هەر وەکی ئەو دانەکێ ڕۆژێ ب تنێ د دنیایێ دا مایین، ئەڤە ڕاگەهاندنەکە بۆ وان وبۆ خەلکێ دی ژی. و ژ مللەتێ سەرداچوویی پێڤەتر کەس ب عەزابا خودێ نائێتە تێبرن.

تشتەک نینە هندی صەبرکێشانێ و کرنا نڤێژا گرانبیت ل سەر مرۆڤی و ئەوە مرۆڤا ژێک جودادکەت باوەردار ل لایەکێ و موناڤق ل لایەک دی



{وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ } [البقرة: ٤٥]

وهوين د هەمی كارێن خۆ دا ب هەمی ڕەنگێن بێنفرەهیيێ هەر وەسا ب نڤێژێ هاريكاريیێ بخوازن، وئەو كارەكێ ب زەحمەتە ب تنێ ل سەر وان نەبت يێن ژ خودێ دترسن،

{يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ} [البقرة:١٥٣]

گەلی خودان باوەران، د هەمی كارێن خۆ دا هوين داخوازا هاريكاريیێ ژ خودێ بكەن: ب صەبرا ل سەر نەخۆشی وموصيبەتان، و ب صەبرا ل سەر هێلانا گونەهان، وخۆڕاگرتنا ل سەر كرنا عيبادەتی، و ب كرنا وێ نڤێژا دل پێ رحەت دبيت، يا كو مرۆڤی ژ كرێتيیێ ددەتە پاش. هندی خودێيە ب هاريكاريیا خۆ يێ د گەل بێنفرەهان. وئەڤ ئايەتە هندێ دگەهينت كو خودێ ب هاريكاريیێ تايبەت د گەل خودان بـاوەرانە، بەلـێ ئەو ب زانينا خۆ د گەل هەمی مرۆڤانە.

دڤان هەردوو ئايەتاندا بوو مە دياربوو كو گرێدانەک تايبەت دناڤبەرا نڤێژێ و صەبرێ دا هەيە، چنكو نڤێژ ئەو ديدارەيە يا



مەخلوقی دگەهینتە خالقێ وی و دلێت باوەردارا تە نا دبن ب تنێ دگەل خودێ.

هەمی ئەو نەخوشی و بەرطەنگیت ژیانێ ئەزمونەکن بوو باوەرداری {وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ } [البقرة:١٥٥]

و ب هندەکێ ژ ترسێ، وبرسێ، وکێمکرنا مالی کو هوین ب زەحمەت وی ب دەست خۆ ڤە بینن، یان هەما هەمییێ ببەین، وهەوە ب مرنێ یان کوشتنا د رێکا خودێ دا، و ب کێمکرنا بەرهەمێ دارقەسپ ومێو ودان ودکاکان، یان خرابکرنا وان، ئەم دێ هەوە جەرببینین. وتو -ئەی پێغەمبەر- مزگینییێ ب وی تشتێ کەیف وخۆشییا دویماهییێ ل دنیایێ وئاخرەتێ دگەهینت، بدە وان یێن بێنفرەهییێ ل سەر ڤێ چەندێ دکەن.

ئەو مرۆڤێت رێ لبەر خۆ بەرزەکرین و ددونیایێ دا کارێ بدل خۆ کرین ئەو ژ عەزاباخودێ ناترسن و ب سڤکی دبینن بەلێ کا بلا ئەو بدەنەهزراخو کا دێ صەبراوان چەندبیت لبەرانبەر عەزابا خودێ



{أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَـٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡعَذَابَ بِٱلۡمَغۡفِرَةِۚ فَمَآ أَصۡبَرَهُمۡ عَلَى ٱلنَّارِ} [البقرة: ١٧٥]

ئانكو: ئەوێن هە ییێن خودانیێن ڤان سالۆخەتان، سەرداچوون ب هیدایەتێ، وعەزابا خودێ ب لێبۆرینا وی گوهارتییە، ڤێجا ئەو چەند ل سەر ئاگری دبستەنە دەمێ کارێ جەهنەمییان دکەن!! خـــودێ ژ ڤی کارێ وان یـــێ عەجێبگرتییە، ڤێجا هوین ژی -گەلی مرۆڤان- ژ بستەیی وبێهنفرەهییا وان ل سەر ئاگری و ژ مانا وان تێدا عەجێبگرتی ببن. وئەڤە کێمکرن وسڤککرنە بۆ وان.

{ لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَلَـٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَـٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلۡمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَـٰمَىٰ وَٱلۡمَسَـٰكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُوفُونَ بِعَهۡدِهِمۡ إِذَا عَـٰهَدُواْۖ وَٱلصَّـٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ }[البقرة: 177]

ئانكو: ل نك خـودێ باشی ئەو نینە هوین د نڤێژێ دا بەرێ خۆ ب لایێ ڕۆژهەلات وڕۆژئاڤایێ ڤە بدەن ئەگەر فەرمانا خودێ پێ نەبت، بەلکی باشی هەمی کارێ وییە یێ باوەری ب خودێ ئینای وپـەرستنا وی ب تـنێ کـری، وبـاوەری ب ڕۆژا دویماهییێ ئینای، و ب هەمی ملیاکەت وکیتابێن هاتینە خوارێ، و ب هەمی



پێغەمبەران بێ جودایی، ومال -د سەر حەژێکرنا خوٚ یا زێدە ڕا بوٚ وی- دایە مروٚڤێن خوٚ یێن نێزیك، وئێتیمان، ووان هەژارێن تێرا هەوجەییا خوٚ مال نەبت، ووان ڕێڤنگێن ژ مال ومروٚڤێن خوٚ دویرکەفتین وموحتاج بووین، ووان خازوٚکێن ژ بێ ڕێ نەچار بووین خواستنێ بکەن، ومال د ئازاکرنا بەنی وئێخسیران دا خەرج کری، و ب کرنا نڤێژێ ڕابووی، وزەکات دای، وئەوێن پەیمانێن خوٚ ب جهـ دئینن، وئەوێ ل دەمێ هەژاری ونەخوٚشییێ و ل دەمێ دژوارییا شەڕی یێ بێهنفرەهـ ئەوێن ب ڤی ڕەنگی بن ئەون یێن د باوەرییا خوٚ دا دڕاستگوٚ، وئەو ئەون یێن خوٚ ژ غەزەبا خودێ پاراستی کو خوٚ ژ بێ ئەمرییا وی دایە پاش.

خودێ سەرکەفتنێ ددەتە وی یێ د صەبرگرتنا خودا بسەرکەفتین وەکو خودێ دڤێ سەرهاتییێ دا بوو مە دیار کری {فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِٱلۡجُنُودِ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبۡتَلِيكُم بِنَهَرٖ فَمَن شَرِبَ مِنۡهُ فَلَيۡسَ مِنِّي وَمَن لَّمۡ يَطۡعَمۡهُ فَإِنَّهُۥ مِنِّيٓ إِلَّا مَنِ ٱغۡتَرَفَ غُرۡفَةَۢ بِيَدِهِۦۚ فَشَرِبُواْ مِنۡهُ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ قَالُواْ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلۡيَوۡمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦۚ قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُواْ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾} [البقرة: ٢٤٩-٢٥٠]



ئانكو: ڤێجا دەمێ طالووت ب لەشكەرێ خۆ ڤە دەركەفتییە شەڕێ عەمالقان، وی گۆتە وان: هندی خودێیە ب ڕوبارەكێ ل پێشییا هەوە دێ هەوە جەڕبینت، كانێ هوین دبێنفرەهن یان نە؛ دا خودان باوەر ودوڕوی ژێك جودا ببن، ڤێجا هەچییێ ژ هەوە ژ ئاڤا وی ڕوباری ڤەخۆت ئەو نە ژ منە، وئەو ب كێر جیهادێ د گەل من نائێت، وهەچییێ ژ ئاڤێ ڤەنەخۆت ئەو ژ منە، چونكی ئەو گوهدارێ منە و ب كێر جیهادێ دئێت، ئەو تێ نەبت یێ بێدەرییەكا ب تنێ ژێ ڤەخۆت ئەوی لۆمە ل سەر نینە، ڤێجا دەمێ ئەو گەهشتینە ڕوباری وان قەستا ئاڤێ كر، وگەلەك ژێ ڤەخوار، هژمارەكا كێم تێ نەبت تەحەملا تێهنێ وگەرمێ كر، وبێدەرییەكا ب تنێ ژێ ڤەخوار، وهنگی ئەوێن گوهداری نەكری پاشڤە مان. ڤێجا دەمێ طالووت وئەو خودان باوەرێن كێم یێن د گەل دا ژ ڕوباری دەرباس بووین بۆ شەڕێ نەیاران، ووان دیتی نەیارێن وان دبۆشن، وان گۆت: شەڕێ جالووتی ولەشكەرێ وی یێ ب هێز ب مە ڤە نائێت، ئینا ئەوێن باوەری هەی كو دێ رابەری خودێ ڕاوەستن، بیرا برایێن خۆ ل هێزا خودێ ئیناڤە وگۆتن: چەند جاران دەستەكەكا كێم یا خودان باوەر وبێنفرەهـ ب ئانەهییا خودێ شیایە



دەستەکەکا بۆش یا کافر وتەعداکەر. وخودێ ب سەرکەفتن وپشتەڤانی ودانا خێرێ یێ د گەل بێنفرەهان.

و دەمێ ئەو هاتینە بەرانبەر جالووتی ولەشکەرێ وی، ووان ترس ب چاڤ دیتی، وان هەوارێن خۆ گەهاندنە خودێ ودوعاکرن وگـــۆتـــن: خـــودایـــێ مـــە بێنفرەهییەکا مەزن ب سەر دلێن مە دا بینە، وپیێن مە بۆ شەڕێ نەیاران موکم بکە، دا ژ سەهما شەڕی ئەم نەڕەڤین، وتو ب هاریکارییا خۆ مە ب سەر مللەتێ کافر بێخە}

صەبر کێشان ژ کارێ وان مرۆڤایە یت راست گوبن دگەل خودایێ خۆ

{ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡمُنفِقِينَ وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ} [ال عمران:١٧]

ئەون یێن ل سەر کرنا عیبادەتی وخۆ دویرکرنا ژ گونەهان و وان نەخۆشییێن ب قەدەرا خودێ دگەهنێ دبێهنفرەهـ، وئەو د گۆتن وکریارێن خۆ دا دڕاستگۆنە، و ب تمامی عیبادەتی دکەن، وئاشکەرا وڤەشارتی خێران ددەن، و ل دویماهییا شەڤان داخوازا ژێبرنا گونەهان بۆ خۆ ژ خودێ دکەن؛ چونکی ل وی دەمی پتر یا بەرهزرە کو دوعا بێنە وەرگرتن.



مرۆڤێ دوو ری و خاین و مونافق چ جارا کەیف ب دل خوشیا باوەرداری ناهێت و بەروڤاژی ب شکەستنا باوەرداری دل خوش بن {إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡ وَإِن تُصِبۡكُمۡ سَيِّئَةٞ يَفۡرَحُواْ بِهَاۖ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ} [ال عمران : ١٢٠]

ئانکو: ئەگەر باشییەك ژ سەرکەفتنەکێ یان مفایەکی گەهشتە هەوە -گەلی خودان باوەران- ئەو پێ ب خەم دکەڤن، وئەگەر نەخۆشییەك ژ شکەستنەکێ یان کێمبوونا مال ومرۆڤ ودەرامەتی گەهشتە هەوە کەیفا وان پێ دئێت، وئەگەر هوین بێهنا خۆ فرەهـ بکەن ل سەر وێ نەخۆشییا دگەهتە هەوە، وتەقوایا خودێ د وی تشتی دا بکەن یێ وی فەرمان پێ ل هەوە کری، نەخۆشییا فێلبازییا وان زیانێ ناگەهینتە هەوە. وخودێ دۆرا ل وی هەمی کاری گرتی یێ ئەو کافر دکەن، وئەو دێ جزایێ وان سەرا وی دەت.

خودێ بەردەوام وان بسەر تێخت یێ دینێ وی بسەردئێخن {بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ هَٰذَا يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ [ال عمران:١٢٥]

بەلێ، ئەڤ هاریکارییە تێرا هەوە هەیە. ومزگینییەکا دی ژی بـۆ هـەوە هـەیـە: ئەگەر هوین بێهنا خۆ ل سەر شەڕێ د گەل



دژمنی فرەهـ بکەن وتەقوایا خودێ ب گوهدارییا فەرمانێن وی بکەن، وکافرێن مەکەهێ د ڤێ دەلیڤەیێ دا ب لەز بێنە شەڕێ هەوە، هزر بکەن ئەو دێ هەوە برینن، خودێ ب پێنچ هزاران ژ ملیاکەتێن نیشانکری، دێ هاریکارییا هەوە کەت، یەعنی: یێن خۆ و هەسپێن خۆ ب نیشانێن ئاشکەرا نیشان کرین.

خودایێ مەزن بەهەشتەک بەرفرەهـ و دیری ژ هەر کێماسیەکێ ئامادەکریە بەلێ بوو وان کەساییە یێ ژ هەژی و خودایێ مەزن کەسێ ژ هەژی ژ یێ نە ژ هەژی جودا دکەت ب جەرباندنێ {أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ} [ال عمران: ١٤٢]

ئانکو: ئەی صەحابییێن موحەممەدی سلاڤ لێ بن ئەرێ هەوە هزر دکر کو هوین دێ چنە بەحەشتێ، بێی هوین ب شەڕ وتەنگاڤییان بێنە جەڕباندن؟ هوین ناچنە بەحەشتێ حەتا هوین نەئێنە جەڕباندن، و ب نیاسینەکا بەرچاڤ خودێ جیهادکەران ژ هەوە بنیاست، ووان ژی بنیاست یێن صەبرێ ل سەر بەرگرییا نەیاران دکێشن.



{وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسۡتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ } [ال عمران:١٤٦]

گەلەك پێغەمبەرێن بۆرین كۆمێن گەلەك ژ هەڤالێن وان شەڕ د گەل وان دا كرینە، ڤێجا ژ بەر وێ برین وكوشتنا گەهشتییە وان ئەو لاواز نەبوون؛ چونكی ئەو د ڕێكا خودایێ وان دا بوو، و ئەو سست نەبوون، وخۆ بۆ دژمنی نەشكاندبوو، بەلكی وان صەبر ل سەر وێ كێشا یا هاتییە سەرێ وان. وخودێ حەز ژ بێنفرەهان دكەت.

كرنا عیبادەتی و دانا خێر و صەدەقە و زەكاتا ئەڤەژی ژ جەرباندنا خودێ فەرمان پێ لمەكرین.

{ لَتُبۡلَوُنَّ فِيٓ أَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ وَلَتَسۡمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَذٗى كَثِيرٗاۚ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ} [ال عمران: ١٨٦]

ئانكو: هوین -گەلی خودان باوەران- ب مالێ خۆ دێ ئێنە جەرباندن، ب دەرێخستنا نەفەقەیێن فەر وسونتەت ژێ، و ب وان گرفتارییێن ب سەر دا دئێن، وهوین د نەفسێن هەوە ژی دا دێ ئێنە جەرباندن ب وان عیبادەتێن ل سەر هەوە هاتینە فەركرن،



وئەوا ب سەرێ هەوە دئێت ژ برین وكوشتن ومرنا خۆشتڤییێن هەوە؛ وئەڤە ژ بەر هندێیە دا خودان باوەرێ ڕاستگۆ ژ یێ دی ئاشكەرا ببت. وهەوە ژ جوهی وفەلان وبوتپەرێسان دێ گوهـ ل گەلەك ژ وان تشتان بت یێن هەوە پێ نەخۆش ژ پەیڤێن شركێ وهاڤێتنا دینێ هەوە. وئەگەر هوین -گەلی خودان باوەران- بێهنا خۆ ل سەر وێ چەندێ فرەهـ بكەن، و ب پێگیرییا فەرمانێن خودێ تەقوایا وی بكەن، ئەو ژ وان كارێن موكمە یێن كو ڤێت مرۆڤ بكەت، ولەزێ تێدا بكەت.

{يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ } [ال عمران:٢٠٠]

ئەی گەلی ئەوێن باوەری ب خودێ وپێغەمبەرێ وی ئینای وكار ب شریعەتێ وی كری، صەبرێ ل سەر گوهدانا خودایێ خۆ بكێشن، و ل سەر وێ تەنگاڤی ونەخۆشییا دئێتە سەرێ هەوە، و ل هەمبەری دژمنێن خۆ دبێفرەهـ بن دا ئەو ژ هەوە د بێنفرەهتر نەبن، و ل سەر جیهادا د گەل نەیارێن من ونەیارێن خۆ هوین دبەردەوام بن، و د هەمی حالێن خۆ دا هوین ژ خودێ بترسن؛ ب ئەوێ هیڤییێ كو هوین ل دنیایێ وئاخرەتێ ڕازیبوونا وی ب دەست خۆ ڤە بینن.



خودایێ مەزن گەلەک کار بساناهی کرینە ل سەر باوەرداری ژوان مەهر کرنا ژنان {وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ مُحۡصَنَٰتٍ غَيۡرَ مُسَٰفِحَٰتٖ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخۡدَانٖۚ فَإِذَآ أُحۡصِنَّ فَإِنۡ أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٖ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ ٱلۡعَنَتَ مِنكُمۡۚ وَأَن تَصۡبِرُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ} [النساء: ٢٥]

ئانکو: وەھچییێ پێڤە نەئێت مەھرا ژنێن ئازاد وخودان باوەر بدەت، بۆ وی ھەیە ھندەکێن دی ژ کچێن خودان باوەر یێن بەنی {جاریە} مارە بکەت. وخودێ ب ڕاستییا باوەرییا ھەوە یێ پڕزانایە، ھندەك ژ ھەوە ژ ھندەکانە، ڤێجا ھوین ب دەستویرییا مرۆڤێن وان وان مارە بکەن، ومەھرا وان یا ھوین ل سەر پێك ھاتین ب دلەکێ خۆش بدەنێ، دا ئەو ژ حەرامییێ دپاراستی بن، نە کو کرێتییێ ئاشکەرا بکەن، یان ب دزی ڤە بکەن وببنە خودان دۆست، ڤێجا ئەگەر وان شوی کر پاشی کرێتییەك کر نیڤا وی حەددی یێ کو ل سەر ژنێن ئازاد ھەی -وئەو جەلدەدانە نەکو رەجماندنە- ل سەر وان ھەیە. ئەڤ مارەکرنا وان ژنێن جاریە ب وی ڕەنگێ بەحس ژێ ھاتییەکرن بۆ ئەوییە یێ ژ خۆ بترست کو خڕابییێ بکەت، ونەشێتە خۆ، وبێفرەھییا ل سەر نەمارەکرنا وان د گەل



دەھمەن پاقژییێ چێتر وباشترە. وخودێ گونەھـ ژێبرێ گونەھێن ھەوەیە، ویێ دلۆڤانکارە ب ھەوە لەو مارەکرنا وان بۆ ھەوە دورست کر ئەگەر ھوین نەشیان ژنێن ئازاد مارە بکەن.

لدەمێ ھەمی کاودانێت ژیانێ لبەر مە بزەحمەت دکەڤن دڤێت ئەم ل سەرھاتین پێغەمبەرێت خودێ بزڤرین و صەبراخو ب وان بینین و ژوان فێری صەبر گرتنێ ببین {وَلَقَدۡ كُذِّبَتۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ فَصَبَرُواْ عَلَىٰ مَا كُذِّبُواْ وَأُوذُواْ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمۡ نَصۡرُنَاۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ وَلَقَدۡ جَآءَكَ مِن نَّبَإِيْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ } [الأنعام:٣٤]

و ب ڕاستی کافران ھندەك پێغەمبەرێن بەری تە درەوین دەرێخستبوون، دەمێ خودێ ئەو بۆ وان ھنارتین، ووان نەخۆشی ئینانە ڕێکا وان، بەلێ وان پێغەمبەران بێهنا خۆ ل سەر وێ چەندێ فرەھـ کر، وبەردەوامی د گازی وجیھادا خۆ دا کر، حەتا سەرکەفتنا خودێ گەھشتییە وان. وچو گوھۆڕین بۆ وان پەیڤێن خودێ نینن یێن وی بۆ پێغەمبەرێ خۆ موحەممەدی سلاڤ لێ بن ھنارتین، کو وی سۆز ب سەرکەفتنێ دایە وی. و ب ڕاستی -ئەی پێغەمبەر- ھندەك ژ بەحسێن پێغەمبەرێن بەری تە ووێ سەرکەفتنا خودێ دایە وان، ووێ غەزەبا خودێ دارێتییە سەر نەیارێن وان بۆ تە ھاتییە. وئەڤە صەبرئینانەکە بۆ وی.



هەر کەسێ زولم لتەکر ئەو دێ گەهیتە دووماهیکا خۆ و چ لبەر خودێ بەرزە نابیت ئەگەر زی یان درەنگ یان ل دونیایێ یان ل ئاخرەتێ مافێ کەسێ بەرزەنابیت {وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمۡ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ فَٱصۡبِرُواْ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ بَيۡنَنَاۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ} [الأعراف: ٨٧]

ئانکو: وئەگەر دەستەکەکێ ژ هەوە باوەری ب ئەوێ ئینا یا خودێ ئەز پێ هنارتیم، ودەستەکەکێ باوەری پێ نەئینا، ئێدی هوین ئەی درەوپێکەر چاڤەرێیی حوکمێ خودێ بن یێ کو دێ ڤەبڕێ ئێختە ناڤبەرا مە، دەمێ ئەو عەزابا وی ب سەر هەوە دا دئێت یا وی هوین پێ ترساندین. وخودێ چێترینێ حوکمدارانە د ناڤبەرا بەنیێن خۆ دا.

نە هەرجارا کەسەکێ کەرب ژتەڤەبوو ئانکو تویێ خەلەتی و ئەو ددرستن نەخێر بەلکو ل دەمێ تو یێ درست کەربێت دووریا پتر ژتە ڤەدبن و پتر کەرباخو ل تە دیاردکەن و ئەڤە ژی بەڵگەیە ل سەر هندێ کو سەرکەڤتن دبن ئەگەرێ دل ئێشانا وان مرۆڤا یت کەرب و نەڤیانا تە رادکەن لەوا بەردەوام بە ل سەر باشیا خۆ و سەرکەڤتنا خۆ {وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتۡنَاۚ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرًا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ} [الأعراف : ١٢٦]



ئانكو: وهەما تە كەرب ژ مە ڤەنابت ژ بەر تشتەكی، ب تنێ نەبت ژ بەر هندێ نەبت كو مە باوەری ئینایە، ومە نیشان وئایەتێن خودایێ خۆ یێن مووسا پێ هاتی ڕاستگۆ دەرێخستینە، ونە تو ونە كەسێ دی -ژ بلی خودێ خودانێ عەرد وعەسمانان- نەشێت هندەك نیشانێن وەكی وان بینت، خودایێ مە تو بێنفرەهییەكا مەزن ب سەر مە دا بەردە ومە موكم بكە، ومە بمرینە پێگیر ب فەرمانا تە ودویكەفتی بۆ پێغەمبەرێ تە.

{قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْۖ إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ} [الأعراف:١٢٨]

مووسای گۆتە مللەتێ خۆ -ژ ئسرائیلییان-: هوین داخوازا هاریكارییێ ژ خودێ دژی فیرعەونی ومللەتێ وی بكەن، وبێهنا خۆ ل سەر وێ نەخۆشییا ژ فیرعەونی گەهشتییە هەوە وعەیالێ هەوە فرەهـ بكەن. هندی عەردە هەمی بۆ خودێیە یێ وی بڤێت ژ بەنییێن خۆ ب میراتگری ئەو لێ ددانت، ودویماهییا باش بۆ ئەوییە یێ تەقوایا خودێ بكەت وپێگیرییێ ب فەرمانێن وی بكەت.



{وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۖ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلۡحُسۡنَىٰ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُواْۖ وَدَمَّرۡنَا مَا كَانَ يَصۡنَعُ فِرۡعَوۡنُ وَقَوۡمُهُۥ وَمَا كَانُواْ يَعۡرِشُونَ }
[الأعراف : ١٣٧]

ئانكو: وئەو ئسرائيلييێن ب خزمەتكارييێ دهاتنه ڕەزيلكرن، مه ل ڕۆژهەلات وڕۆژئاڤايا عەردى (كو وەلاتێ شامێيه) كرنه جێگر، ل وى عەردێ مه بەرەكەت كرييه تێدا، كو ڕويبار وفێقى ودەرامەتێ وێ مشەكرى، وپەيڤا خودايێ ته يا باش ل سەر ئسرائيليان پێكهات كو وان ل عەردى بكەته خودان دەسهەلات؛ ژ بەر صەبركێشانا وان ل سەر نەخۆشييا ژ فيرعەونى ومللەتێ وى گەهشتييێ، وهەر تشتەكێ فيرعەونى ومللەتێ وى چێ كرى، وتشتێ وان ئاڤا كرى ژ ئاڤاهى ورەز وبيستانان مه خڕابكرن وپەلـخواندن.

لدەمێ تو گوهداريا خودێ و پێغەمبەرێ وى دكەى ئەو ته مفا گەهانده خۆ و ئيمان كامل نابيت بێ گوهداريكرنا خودێ پێغەمبەرێ سلاڤ لێ نەوەكى وان كەسێت دنوكەدا ئەم دبينين باوەرى ب حەديث ێن پێغەمبەرى نينن سلاڤ لێ و دبێژن ئەم ب تنێ قورانێ درست دبينين و فەرماناخودێ ب تنێ بجهـ تينين بەلێ ئەوا راستى نە گۆت چنكو دڤێ ئايەتێ دا يا گۆتێ گوهداريا



خودێ پێغەمبەری بکەن سلاڤ لێ ئەوا خودێ و پێغەمبەرێ وی سلاڤ لێ فەرمان لمە کری دڤێت هەمیێ بجهـ بینینبوو مە خوش بیت یان نەخوش نابیت دینی لدیڤ حەزو ئارەزوێت خۆ ببەین دڤێت ب پێگریکرنا مە ب فەرماناخودێ و پێغەمبەری سلاڤ لێ ئەم صەبرێ بکێشین {وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَـٰزَعُوا۟ فَتَفْشَلُوا۟ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ ۖ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ} [الأنفال : ٤٦]

ئانکو: وهوین د هەمی حالێن خۆ دا پێگیرییێ ب گوهدارییا خودێ وپیغەمبەرێ وی بکەن، وهوین د ناڤبەرا خۆ دا ب هەڤرکی نەچن دا گۆتنا هەوە ژێکڤە نەبت ودلێن هەوە ژێك دویر نەکەڤن، ڤێجا هوین لاواز ببن وهێز وسەرکەفتنا هەوە نەمینت، ودەمێ هوین دچنە بەرانبەر دژمنی هوین دبێنفرەهـ بن. هندی خودێیە ب هاریکاری وپشتەڤانییێ یێ د گەل بێنفرەهان، وئەو وان شەرمزار ناکەت. لڤێ ئایەتێدا خودێ گۆتیە هندی خودێیە ب هاریکاری وپشتەڤانییێ یێ د گەل بێنفرەهان، وئەو وان شەرمزار ناکەت ئەفجا بهن فرەهیاتە سەرکەڤتن ددیفدایە و خودێ زولمێ لکەسێ ناکەت و وەعدا وی حەقە و راستە ئەڤ جا پشتی هەمی نەخوشیا چاڤەرێ خوشیەکێ بە.



ئەو هێزا بهن فرەهی لمروفی زێدەدکەت پترە ژ هزر و تەخمینا مە وەکی خودایێ مەزن د قورانا پیروزدا بوو مە گۆتی {يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَى ٱلۡقِتَالِۚ إِن يَكُن مِّنكُمۡ عِشۡرُونَ صَٰبِرُونَ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ} [الأنفال: ٦٥]

ئەی پیغەمبەر تو خودان باوەران بۆ شەڕکرنێ پال بدە، ئەگەر بیستێن بێنفرەهـ د ناڤ هەوە دا هەبن دەمێ هوین بەرانبەر دژمنی ڕادوەستن هوین دێ شێنە دوسەدان ژ وان، وئەگەر سەدێن جیهادکەر وبێنفرەهـ د ناڤ هەوە دا هەبن هوین دێ شێنە هزار کافران؛ چونکی ئەو مللەتەکن نزانن کانێ خودێ چ بۆ موجاهدان ئامادەکرییە، وهەما ب تنێ بۆ خڕابکاری وخۆمەزنکرنا د عەردی دا ئەو شەڕی دکەن. ژڤێ ئایەتێ بلا بوو مە یا دیاربیت کا ئەوا ب بهن فرەهیێ بدەست ڤە تێت چەندا مەزنە گەلەک ژ نەخوشێت ئەڤرۆ د نەخوشخاناڤە و خودانێت نەخوشیت گرانن دێ بینی ئەوێت خودان ئیمان دناڤ واندا چەند بصەبرن و چەند د سوپاسدارێت خودێ نە و چەند بهێزترن و ناهێلن بێ هیڤی بوون دورێت وان بگریت و راستە کا چەند صەبر هێزێ لمە زێدەدکەت.



{ٱلۡـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗاۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ صَابِرَةٞ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمۡ أَلۡفٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفَيۡنِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ} [الأنفال: ٦٦]

ئانكو: نوكه گەلی خودان باوەران ژ بەر لاوازییا هەوە خودێ ل سەر هەوە سڤك كر، ڤێجا ئەگەر سەدێن بێنفرەهـ د ناڤ هەوە دا هەبن دێ شێنە دوسەد كافران، وئەگەر هزار ژ هەوە هەبن ب ئانەهییا خودێ دێ شێنە دو هزاران ژ وان. وخودێ ب سەركەفتن وپشتەڤانییا خۆ یێ د گەل بێنفرەهان.

نە ب تنێ صەبر دێ تە ببها ئێخیت لدەف خودێ بەلكو شیرەتكرناتە بوو هەڤالێ تە ب صەبركێشانێ دێ تە ببها كەت لدەف خودێ

{ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ} [البلد: ١٧]

پاشی ئەو د گەل كرنا ڤان خێرێن ژێگۆتی ژ وان بوو یێن ئیخلاص د باوەرییا خۆ ب خودێ دا كری، وشیرەت ب بێهنفرەهییا ل سەر گوهدارییا خودێ وخۆ پاشڤەبرنا ژ بێ ئەمرییا وی ل ئێك ودو كرین، وشیرەت ب دلۆڤانییا د گەل خەلكی ل ئێك ودو كرین.



{إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ } [العصر: ٣]

ئانكو: ئەو تێ نەبن يێن باوەرى ب خودێ ئيناى وكرياريێن چاك كرين، وهندەك ژ وان شيرەت ب حەقييێ ل هندەكان كرين، وشيرەت ب صەبرێ ل ئێك ودو كر.

{وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ وَٱصۡبِرۡ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ}

[يونس: ١٠٩]

ئانكو: وتو -ئەى پێغەمبەر- دويچوونا وێ وەحييا خودێ بكە يا ئەو بۆ تە دهنێرت وكارى پێ بكە، وتو بێهنا خۆ ل سەر وان فرەهـ بكە يێن گوهدارييا نەكەن، حەتا خودێ حوكمى د ناڤبەرا تە ووان دا بكەت، وئەو چێترينێ حوكمدارانە؛ چونكى حوكمێ وى داديا تمام تێدا هەيە.

بەردەوام نمونا بهن فرەهيێ بوو مە بسلمانا پێغەمبەر و هنارتين خودێ نە ژ چاك و وەليت وى ئەون يت كو ئەم پێدڤييە ل هەمى بەرطەنگيا دا وان لبيراخو بينين نمونا صەبر كێشانێ نە بوو مە {وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ۝٨٥ وَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ فِي رَحۡمَتِنَآۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ۝٨٦} [الانبياء: ٨٥-٨٦]



ئانكو: وتو بەحسێ ئیسماعیل وئدریس وذولكفلی بكە، ئەو هەمی ژ صەبركێشان بوون. ومە ئەو كرنە د دلۆڤانییا خۆ دا، هندی ئەون ئەو ژ وان بوون یێن ژ سەرڤە و د دل دا دچاك، وگوهدارییا خودێ د ئەمر وفەرمانێن وی دا كرین.

زەحمەتر ژ هەلبژارتنا ابراهیمی و كوڕێ وی ئیسماعیلی نە بوو بەلێ ئیمانا وان هندە یا بهێز بوو صەبرا وان و رازیبوونا وان ب فەرمانا خودێ بسەر هەر تشتەكێ دی دكەفت رازیبوونا خودێ وان هەلبژارتن و هەردوو د صەبر كێشاناخودا بسەر كەڤتن {فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعۡيَ قَالَ يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ فَٱنظُرۡ مَاذَا تَرَىٰۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ} [الصافات: ١٠٢]

ئانكو: ودەمێ ئیسماعیل مەزن بووی و د گەل بابێ خۆ گەڕیای بابێ وی گۆتێ: ئەزێ د خەونێ دا دبینم كو ئەزێ تە سەرژێ دكەم، ڤێجا تو چ دبێژی؟ {وخەونا پێغەمبەران حەقییە} ئیسماعیلی ژ ڕازیبوونا ب ئەمرێ خودایێ خۆ، و ژ باشییا د گەل بابێ خۆ، گۆت: وێ بكە یا خودێ فەرمان پێ ل تە كری ژ سەرژێكرنا من، ئەگەر خودێ حەز بكەت تو دێ من ژ وان بینی یێن صەبرێ دكێشن و ب ئەمرێ خودێ دڕازی.



باوەرداریێ راست و دروست خودانێ ڤان سیفەتایە {ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمۡ وَٱلۡمُقِيمِي ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ } [الحج: ٣٥]

ئانكو: ئەوێن ژ سالۆخەتێن وانە ئەگەر بەحسێ خودێ ب تنێ هاتەكرن ئەو ژ عەزابا وی دترسن، وخۆ ژ بێ ئەمرییا وی ددەنە پاش، وئەگەر نەخۆشی وتەنگاڤییەك گەهشتە وان ئەو بێهنا خۆ ل سەر وێ چەندێ فرەهـ دكەن ب ئەوێ هیڤییێ كو خودێ خێرێ بدەتە وان، و ب دروستی ب كرنا نڤێژێ ڕادبن، و د گەل هندێ ژی ئەو ژ وی ڕزقێ مە داییێ زەكاتا واجب ونەفەقا ل سەر عەیالی خەرج دكەن، ومالی د ڕێكا خودێ ودانا خێران دا ددەن.

{إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلۡحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمۡ وَٱلۡحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا} [الأحزاب: ٣٥]

ئانكو: هندی ئەو زەلام وژنكن یێن خۆ ب دەست ئەمرێ خودێ ڤە بەردای، وییێن باوەری ب خودێ وپێغەمبەرێ وی ئینای، وییێن گوهدارییا خـــودێ كری، وییێن د گۆتنێن خـۆ دا دڕاستگۆ، وییێن



صەبرێ ل سەر ئەمرێ خودێ ونەخۆشییان دکێشن، وییێن ژ خــودێ دترسن، وییێن خێرکەر، وییێن ڕۆژیگر، وییێن نامویسا خۆ ژ زنایێ وکرێتییێ دپارێزن، وییێن ب دل وئەزمانی خـــودێ ل بیرا خۆ دئینن، خودێ گونەهـ ژێبرن وخێرەکا مەزن، کو بەحەشتە، بۆ ڤان ئامادە کرییە.

ئەڤ دونیایە وارێ ئەزمون و جەرباندنایە دا کەسێت ئەهلێ خودێ بهێنە خەلاتکرن و ئەهلێ شەیتانی بهێنە جزادان {وَلَنَبۡلُوَنَّكُمۡ حَتَّىٰ نَعۡلَمَ ٱلۡمُجَٰهِدِينَ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبۡلُوَاْ أَخۡبَارَكُمۡ [محمد : ٣١]

ئانکو: وئەم ب شەڕ وجیهادا دوژمێن خودێ دێ هـــەوە جەڕبینین -گەلی خودان باوەران- حەتا ب کرنا جیهادێ جیهادکەر وصەبرکێش ئاشکەرا ببن، وئەم دێ گۆتن وکریارێن هەوە ژی جەڕبینین دا یێ ڕاستگۆ ژ یێ دەروین جودا ببت.

ل سەرهاتیا موسا پێغەمبەری سلاڤ لێ دگەل خدری ئەو دەرئەنجامێت رویدانا یت فەشارتی بومە دیار دکرن و دچەند نمونەکاندا قوران بومە دیار دکەت دسورت الكهف دا کو هەر چیا دهێت سەرێ مروفی خێرا مروفی یا تێدا و ئەگەر مە مروفا تشتەک ژ غەیبێ زانیبا ئەم دا هەر وێ هەلبژێرین یا خودێ کریە قەدەرا



مه ژ خوشی و نەخوشییا چەندین نموونە خدری بوو موسای (سلاڤ لێ بن) دیار کرن و ئەگەر موسای پتر صەبر کێشابا و بەردەوام پرسیار نەکربان هەتا دەرئەنجام دیتبان دا پتر بوو مە دیار بیت چەندین نمونێت دی و خودێ زاناترە {قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا} [الكهف:٦٧]

خدری گۆتێ: هندی تویی -ئەی مووسا- تو نەشێی بێهنا خۆ ل سەر دویکەفتن وهەڤالینییا من فرەهـ بکەی.

{وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴿٦٨﴾ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِي لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾} [الكهف: ٦٨-٦٩]

ئانكو: وچاوا تو دێ شێی بێهنا خۆ ل سەر وان تشتان فرەهـکەی یێن کو ئەز دێ کەم وئەو ل بەر تە دبەرزە ژ وان یێن خودێ نیشا من داین؟مـــووسای گــۆتــێ: ئەگەر خودێ حەز بکەت تو دێ من بینی یێ بێهن فرەهـ ل سەر وی تشتێ ئەز دێ ژ تە بینم، وئەز د تشتەکی دا بێ ئەمرییا تە ناکەم.



{قَالَ أَلَمۡ أَقُلۡ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرًا }[الكهف : ٧٢]

ئانكو: خدرى گۆتیێ: ل سەرى من گۆتبوو تە: هندى تويى تو نەشێى بێهنا خۆ ل سەر هەڤالينييا من فرەهـ بكەى.

{ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرًا} [الكهف:٧٥]

خدرى بۆ بيرئينان ولۆمەكرن گۆتە مووساى: ئەرێ ما من نەگۆتبوو تە تو نەشێى بێهنا خۆ ل سەر وان كريارێن من يێن تە چو زانين پێ نە فرەهـ بكەى؟

{قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيۡنِي وَبَيۡنِكَۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأۡوِيلِ مَا لَمۡ تَسۡتَطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرًا} [الكهف:٧٨]

خدرى گۆتە مووساى: ئەڤە دەمێ ژێكڤەبوونێیە د ناڤبەرا من وتە دا، ئەز دێ بۆ تە بەحسێ وان كريارێن خۆ كەم يێن تە پێ نەخۆش بووى، وتو نەشياى بێهنا خۆ ل سەر فرەهـ بكەى وپسيارا وان نەكەى. خدر ب ئەمرێ خودێ تعالا و ئەو زانينا خودێ داييە وى فەرماناخودێ بجهـ تينات بەلێ بسەرڤە دياربوو كو باشى د كريارێت وى دانينە بەلێ لدەمێ دوماهيكا كارى بوومە دداى ديار كرن ئيكسەر مروڤێ بعاقل تێدگەهت كو چناهێتە رێكاوى ژ نەخوشيێ ئەگەر خێرەک لپشت را نەبيت بەلێ حيكمەت لڤێرێ



ئەڤەیە کا صەبرامە چەندە ل سەر نەخوشییێ. ل تەمامیا ئایەتێدا خودایێ مەزن گۆتنا خدری بۆ مە ڤەدگوهێزیت و بۆ مە ددەتە دیارکرن و دبێژیت:

{وَأَمَّا ٱلۡجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ فِي ٱلۡمَدِينَةِ وَكَانَ تَحۡتَهُۥ كَنزٞ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحٗا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبۡلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسۡتَخۡرِجَا كَنزَهُمَا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ وَمَا فَعَلۡتُهُۥ عَنۡ أَمۡرِيۚ ذَٰلِكَ تَأۡوِيلُ مَا لَمۡ تَسۡطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرٗا} [الكهف:٨٢]

وئەو دیوارێ من خواربوونا وی ڕاستکری ئەو یێ دو کوڕکێن ئێتیم بوو ل وی باژێڕی یێ دیوار لێ، و دبن وی دیواری ڤە خزینەیەکا ژ زێڕ وزیڤی یا وان هەر دووان هەبوو، وبابێ وان زەلامەکێ چاك بوو، ڤێجا خودایێ تە ڤیا ئەو هەردو مەزن ببن و ب هێز بکەڤن، وئەو خزینەیا خۆ دەربێخن، ئەڤە ژ دلۆڤانییا خودایێ تە بوو ب وان، وئەو هەمی کریارێن تە دیتین من کرین ئەی مووسا من ژ نك خۆ نەکرینە، بەلکی من ب فەرمانا خودێ ئەو کرن، ئەوا هە یا من ئەگەرێن وێ بۆ تە دیارکرین ئەو دویماهییا وان کارانە یێن تە نەشیای تو بێنا خۆ ل سەر فرەهـ بکەی وپسیار ژێ نەکەی.



دلىَ خۆ ب گۆتنا خودايىَ خۆ ئارامبكه و بزانه هەچيا تو ديرو مستەحيل دبينى لدەف وى بساناهيه {فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا ٥ إِنَّهُمۡ يَرَوۡنَهُۥ بَعِيدٗا ٦ وَنَرَىٰهُ قَرِيبٗا ٧}[المعارج ٥-٧]

ئانكو: ڤێجا تو -ئەى پێغەمبەر- صەبرىَ ل سەر ترِانەپێكرن ولەزكرنا وان د عەزابىَ دا بكێشە، صەبرەكا جوان وبىَ گازندە. هندى كافرن عەزابىَ دوير دبينن وهزر دكەن ئەو نائێت. وئەم وىَ نێزيك دبينين وهەردىَ ئيت.

صەبرا خودان باوەرى ل سەر بجهـئينانا فەرماناخودىَ كاچەوا خەلاتەک مەزن هەيە، هەر وەسا كەسىَ بىَ باوەر جزادانەک مەزن بوو هەيە ل سەر وىَ بىَ ئەمرياخودىَ ياوى د دونيايىَ دا دكرى و هزر دكر چ رِوژ نين ئەو حسابا كارىَ وى كرى وەربگريت بەلىَ خودىَ دبێژيت كا دىَ چەوا ئەو شێن بصەبر بن ل سەر عەزابا خودىَ ئەڤجا ئەگەر عاقل هەبن دىَ تێگەهن وان شيان نينە صەبرىَ بكێشن لەوا تەوبەكرنا بەرى مرنىَ بلا بهەلبژێرن بەرى مرن بهێتو خۆزيا بوو زفرينا ژيانىَ بخوازن خودىَ دڤى دەربارەيى دا دبێژيت:



{فَإِن يَصۡبِرُواْ فَٱلنَّارُ مَثۡوًى لَّهُمۡۖ وَإِن يَسۡتَعۡتِبُواْ فَمَا هُم مِّنَ ٱلۡمُعۡتَبِينَ } [فصلت: ٢٤]

ئانكو: ڤێجا ئەگەر ئەو بێهنا خۆ ل سەر عەزابێ فرەهـ بكەن ئاگر دێ جهێ وان بت، وئەگەر ئەو داخوازا زڤڕینا بۆ دنیایێ بكەن؛ دا باشییان بكەن، بەرسڤا وان بۆ ئەوێ چەندێ نائێتەدان، وعوزرا وان ژی نائێتە وەرگرتن.

{ٱصۡلَوۡهَا فَٱصۡبِرُوٓاْ أَوۡ لَا تَصۡبِرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ} [الطور : ١٦]

ئانكو: هوین تام بكەنە گەرما ڤی ئاگری، ڤێجا هەوە دڤێت بێهنا خۆ ل سەر نەخۆشییا وی فرەهـ بكەن، هـەوە دڤێت فرەهـ نەكەن، عەزاب ل سەر هەوە نائێتە سڤككرن، وهوین ژێ دەرناكەڤن، وبۆ هەوە وەكی ئێكە هوین بێهنا خۆ فرەهـ بكەن یان نە، هەما جزایێ وی كاری بۆ هەوە دێ ئێتەدان یێ هەوە د دنیایێ دا دكر.

هەر وەسا سەرهاتیا ملەتێ موسای لدەمێ قوران بومە بەحس دكەت {وَإِذۡ قُلۡتُمۡ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصۡبِرَ عَلَىٰ طَعَامٖ وَٰحِدٖ فَٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُخۡرِجۡ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۢ بَقۡلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَاۖ قَالَ أَتَسۡتَبۡدِلُونَ ٱلَّذِي هُوَ أَدۡنَىٰ بِٱلَّذِي هُوَ خَيۡرٌۚ ٱهۡبِطُواْ مِصۡرٗا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلۡتُمۡۗ وَضُرِبَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلۡمَسۡكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٖ



مِّنَ ٱللَّهِۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ } [البقرة: ٦١]

ئانكو: و ل بيرا خۆ بينن دەمێ مە خوارنا شرين، وتەيرێن خۆش، ب سەر هەوە دا ئينباينە خوارێ، ڤێجا وەكى هەر جار هەوە قەنجى ژ بيركر، وبێنتەنگى وشڕاتى گەهشتە هەوە، وهەوە گۆت: ئەى مووسا ئەم نەشێين ب خوارنەكا ب تنێ يا نەئێتە گوهاڕتن خۆ بگرين، ڤێجا تو بۆ مە ژ خودايێ خۆ بخوازە دا ئەو هندەك خوارنێن دى ژ دەركەفتييێ عەردى، ژ بەقلى وشينكاتى، وترۆزى ودان ودكاكێ دئێتە خوارن، ونيسك، وپيڤازان، بدەتە مە. مووساى -ب نەڕازيبوون ڤە- گۆت: ئەرێ ما هوين ڤان خوارنێن كێم بهاتر دخوازن، وڤى ڕزقێ ب مفا يێ خودێ بۆ هەوە هلبژارتى هوين دهێلن؟ ژ ڤێ دەشتێ هەڕنە هەر بازێڕەكێ هەى، گەلەكێ ژ تشتێ دلێ هەوە دچتێ ل بيستان وبازاڕێن وى دێ بينن. ودەمێ ئەو چووين بۆ وان ئاشكەرا بوو كو ئەو د هەمى جهان دا هلبژارتنا خۆ ب پێش يا خودێ دئێخن، وئەو دلچوونێن خۆ بەرى وێ ددانن يا خودێ بۆ وان هلبژارتى؛ لەوا سالۆخەتێ رەزيلييێ وهەژارييا دلـى ب وان ڤە نويسيا، وئەو زڤڕين غەزەبا خودێ د گەل دا؛ چونكى وان پشت دا دينێ خودێ، وچونكى وان باوەرى ب ئايەتێن خودێ نەدئينا و ژ دژمنى وزۆردارى وان پێغەمبەر دكوشتن؛ ئەڤە ژ بەر



وێ نەگوهداری وزێدەگـاڤییا وان ل سەر توخویبێن خودایێ خۆ کری.



# خەلاتێن خودێ بۆ صەبر كێشى

خودایێ مەزن و دلۆڤان بەردەوام بباشى و خەلات دان بەحس ل صەبر كێشا كریە ژوان ئایەتا

{إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٌ وَأَجۡرٌ كَبِيرٌ} [هود : ١١]

ئانكو: بەلێ ئەوێن صەبر ل سەر نەخۆشییێ كێشاى ژ بەر باوەرییا وان ب خودێ وكو وان بۆ خۆ ب خێر حسێبكرى، ووەك سوپاسى بۆ خودێ كریارێن چاك كرین، ئەڤان ژێبرنا گونەهان وخێرەكا مەزن ل ئاخرەتێ بۆ وان هەیە.

{وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ} [الرعد:٢٢]

وئەو ئەون یێن پێخەمەت ڕازیبوونا خودێ صەبر ل سەر نەخۆشییێ وگوهدارییا وى كێشاى، ونڤێژ ب ڕەنگەكێ تمام پێك ئینای، وزەكاتا مالێ خۆ یا فەر داى، وئاشكەرا وڤەشارتى خێر ژێ داین، و ب باشییێ خڕابییێ پاشڤەدبەن دا ئەو وێ ژێ ببەت، ئەوێن ب ڤان سالۆخەتان دویماهییا باش ل ئاخرەتێ بۆ وانە.



{ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ } [النحل: ٤٢]

ئەوێن هە يێن د ڕێكا خودێ دا مشەخت بووين ئەون يێن صەبر ل سەر ئەمرێ خودێ ومقەدەرێن وی يێن نەخۆش كێشای، وئەو خۆ دهێلنە ب هيڤييا خودايێ خۆ ب تنێ ڤە، لەو ئەو هێژای ڤێ دەرەجا مەزن بوون.

رەحما خودێ و داناوی بومە پترە ژوێ يا ئەم درێكاوی دا ددەين.

{مَا عِندَكُمۡ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٖۗ وَلَنَجۡزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ} [النحل:٩٦]

ئەو تشتێ ل نك هەوە هەی ژ پەرتالێ دنيايێ دێ چت ونامينت، وئەو رزق وخێرا ل نك خودێ بۆ هەوە هەی ناچت ودێ مينت. وئەوێن گرانييا تەكليف وفەرمانێن مە هلگرتين -و وەفاداری ئێك ژ وان فەرمانانە- مسوگەر ئەم خێرا باشترين كريارێن وان دێ دەينێ، وئەو خێرا ئەم سەرا كارێ وان يێ كێم ددەينێ ژ قەنجييا مە دێ وەكی وێ بت يا ئەم سەرا كارێ وان يێ گەلەك ددەينێ.

{إِنِّي جَزَيۡتُهُمُ ٱلۡيَوۡمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ} [المؤمنون:١١١]



هندى ئەزم من جزایێ ڤێ دەستەکێ ژ بەنییێن خۆ کرە بەحەشت؛ ژ بەر صەبرکێشانا وان ل سەر نەخۆشییێ وگوهدارییا خودێ.

{أُوْلَـٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ وَيُلَقَّوۡنَ فِيهَا تَحِيَّةٗ وَسَلَٰمًا } [الفرقان : ٧٥]

ئانکو: ئــەوێــن هـــە يێن ئەڤ سالۆخەتە ل نك هـــەيــن ژ بەنییێن خودایێ رەحمان، خــێــرا وان دێ بلندترین جــهــبـــت ل بەحەشتێ؛ ژ دلۆڤانییا خودێ و ژ بەر صەبرکێشانا وان ل سەر عیبادەتان، و د بەحەشتێ دا ملیاکەت دێ سلاڤی وان کەن،

{أُوْلَـٰٓئِكَ يُؤۡتَوۡنَ أَجۡرَهُم مَّرَّتَيۡنِ بِمَا صَبَرُواْ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ} [القصص: ٥٤]

ئەوێن هە یێن سالۆخەتێن وان بۆرین خێرا کارێ وان دوجارکی بۆ وان دئێتەدان: ژ بەر باوەری ئینانا وان ب کیتابێن وان ب خۆ، و ژ بەر باوەری ئینانا وان ب قورئانێ ژی و وێ صەبرا وان کێشای، و ژ سالۆخەتێن وانە ئەو ب باشییێ خرابییێ پاشدا دبەن، و ژ وی رزقێ مە دایێ ئەو مالی د رێکا خێرێ وباشییێ دا خەرج دکەن.



{ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ } [العنكبوت: ٥٩]

ئانكو: هندى ئەو بەحەشتن يێن بەحس ژێ هاتييەكرن بۆ وان خودان باوەرانە يێن صەبر ل سەر گوهدارييا خودێ كێشاى، وپێگرى ب دينێ خۆ كرى، و د ڕزق وجيهادا دژمنى دا خۆ دهێلنە ب هيڤييا خودێ ڤە.

{وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةً يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ} [السجدة : ٢٤]

ئانكو: ومە هندەك پێشبەر وڕێنيشاندەر د ناڤ ئسرائيليان دا دانان، وان بەرێ وان ددا خێرێ وتەوحيد وعيبادەت وگوهداريا خودێ، خەلكى دويكەفتنا وان دكر، وئەو گەهشتنە ڤێ دەرەجا بلند ژ بەر كو وان صەبر ل سەر فەرمانا خودێ دكر، وبەرێ خەلكى ددا خودێ، ووان د ڕێكا خودێ دا تەحەملا هەمى نەخۆشييان دكر، ووان باوەرييەكا باوەرى ب ئايەت ودەليلێن خودێ دئينا.

{وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٖ} [فصلت: ٣٥]

ئانكو: وهەما بەس تەوفيقا وان بۆ ڤى سالۆخەتێ باش دئێتەدان يێن بێهنا خۆ ل سەر وى تشتى فرەهـ كرى يێ بۆ وان نەخۆش،



وكــوتــەكــى ل خۆ كرى دا وى تشتى بكەن يێ خودێ دڤێت، وهەما بەس تەوفيقا وى بۆ ڤێ چەندێ دئێتەدان يێ بارەكا مەزن ژ خۆشييا دنيايێ وئاخرەتێ بۆ هاتييەدان.

{وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ} [الحجرات: ٥]

ئانكو: وئەگەر وان بێهنا خۆ فرەهـ كربا حەتا تو دەردكەفتييە نك وان، ئەو ل نك خودێ بۆ وان دا چێتر بت؛ چونكى خودێ فەرمان ل وان كرييە ئەو قەدرێ تە بگرن، وخودێ باش گونەهـ ژێبرە بـۆ وى تــشــتــێ وان ژ نــەزانــيــن كرى، ويێ دلۆڤانكارە ب وان لەز د عەزابدانا وان دا نەكرييە.

{وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا} [الانسان : ١٢]

ئانكو: و ژ بەر صەبرا وان ل سەر خێرێ ل دنيايێ كێشاى جزايێ وان كرە بەحەشتەكا مەزن، وئەو ئارميشێ نەرم تێدا دكەنە بەر خۆ.



{وَٱصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ} [هود: ١١٥]

وتو -ئەی پێغەمبەر- بێهنا خۆ ل سەر نڤێژێ فرەهـ بکە، و ل سەر هەر نەخۆشییەکا تو ژ بوتپەرێسێن مللەتێ خۆ ببینی؛ چونکی هندی خودێیە خێرا کریارێن قەنجیکاران بەرزە ناکەت.

{وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُ فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ} [النحل: ١٢٧]

وتو -ئەی پێغەمبەر- بێنا خۆ فرەهـ بکە ل سەر وێ نەخۆشییا د رێکا خودێ دا دگەهتە تە حەتا خۆشی دگەهتە تە، وبێنفرەهییا تە ب تنێ ب خودێیە، ئەوە یێ هاریکاری وپشتەڤانییا تە دکەت، وتو ل سەر وی ب خەم نەکەڤە یێ گوهدارییا تە نەکەت و د گازییا تە نەئێت، وتو ژ فەند وفێلێن وان بێن تەنگ نەبە.

{وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا } [الكهف:٢٨]

وتو -ئەی پێغەمبەر- بێهنا خۆ د گەل وان هەڤالێن خۆ یێن هەژار فرەهـ بکە ئەوێن خودایێ خۆ ب تنێ دپەرێسن، و ل سپێدە وئێڤاران دوعایان ژ وی دکەن، وان ب ئەوێ چەندێ کنارێ وی دڤێت، وتو د گەل وان رِوینە وتێکەلییا وان بکە، وبەرێ خۆ ژ وان



وەرنەگێڕە کافران ب هێجەتا خۆشیبرنا ب خەملا ژینا دنیایێ، وتو گوهدارییا وی نەکە یێ مە دلێ وی ژ زکرێ خۆ بێ ئاگەهـ کری، ووی دلچوونێن خۆ ب سەر گوهدارییا خودایێ خۆ ئێخستین، ومەسەلا وی د هەمی کارێ وی دا بوویە زەعێبوون وتێچوون.

د گەلەک ژ ئایەتاندا ناڤێ نڤێژێ و صەبرێ دگەل ئێک هاتیە هەر وەکو نڤێژ ئەو بەشێ گرنگە یێ کو صەبرێ لمە زێدەبکەت {يَـٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ } [لقمان : ١٧]

ئانکو: ئەی کوڕکێ من تو نڤێژێ ب دورستی بکە، وفەرمانا ب باشییێ بکە، وپاشڤەبرنا ژ خراببیێ بکە، ب ڕەنگەکێ نەرم وتازە و ل دویڤ شیانا خۆ، وتو خۆ ل بەر وێ نەخۆشییێ بگرە یا سەرا ڤێ چەندێ دئێتە سەرێ تە، وتو بزانە کو ئەڤ شیرەتە ئەون یێن خودێ فەرمان پێ کری وییێن دڤێت مرۆڤ یێ لێ مجد بت.

{وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ } [الطور:٤٨]

وتو -ئەی پێغەمبەر- بێهنا خۆ ل سەر حوکم وفەرمانا خودایێ خۆ فرەهـ بکە، کو پەیاما وی دایە تە بگەهینی وتەحەملا وێ نەخۆشییێ بکەی یا ژ مللەتێ تە دگەهتە تە، هندی تویی تو یێ



ل بەر چاڤێن مە ویێ ل بن چاڤدێرییا مە، ودەمێ تو ژ خەو ڕادبییە نڤێژێ، و ب شەڤێ ژی تو ب سوپاسی تەسبیحا خودایێ خۆ بکە ووی مەزن ببینە، ونڤێژێ بۆ وی بکە، و ل دەمێ نڤێژا سپێدێ دەمێ ستێر ئاڤا دبن تو وێ چەندێ بکە. وئەڤ ئایەتە سالۆخەتێ هەبوونا دو چاڤان بۆ خودێ بنەجهـ دکەت، ب ڕەنگەگێ هێژای وی بێی چاوانییەك بۆ بێتە دەسنیشانکرن، وئەڤ چەندە ب سوننەتێ وئیجماعا پێشییێن ئوممەتێ ژی بنەجهـ بوویە.

د ئەڤرۆکەدا گەلەک ژ خەمێت مە گۆتنا خەلکێ نە ئەڤە ژی گۆتنا وان بەلکو نە ژبەر خەلەتیەک یامەنە مە ڕاست ڤە بکەن بەلکو ژ ڕاستیا مەیە و ڕێ بەرزەبوونا وانە، لدەمێ ئیک ژ مە د ئەڤرۆکەدا ئەمرێ خودێ و پێغەمبەرێ وی بجهـ بینیت دڤێت صەبرەکا زێدە هەبیت ل سەر گۆتنێت خەلکێ و ئەڤ کارە نە ژنوکە وەرە بسەرێ باوەرداری هاتیە، و ئەو ئایەتا پتری هەمیا لبیراخۆ تینم دەربارەیی ڤی بابەتی ئەڤ ئایەتەیە{وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهۡجُرۡهُمۡ هَجۡرٗا جَمِيلٗا} [المزمل: ١٠]



ئانكو: وتو بێهنا خۆ ل سەر وی تشتی فرەهـ بکە یێ بوتپەرێس د دەر حەقا تە ودینێ تە دا دبێژن، وتو د کریارێن وان یێن نەحەق دا چاڤ ل وان نەکە، وپشت بدە وان، وتۆلێ لێ ڤەنەکە.

{تِلۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهَآ إِلَيۡكَۖ مَا كُنتَ تَعۡلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوۡمُكَ مِن قَبۡلِ هَٰذَاۖ فَٱصۡبِرۡۖ إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ } [هود: ٤٩]

ئانكو: ئەو سەرهاتییا هە یا مە بۆ تە ڤەگێڕای ژ بەحسێ نووحی ومللەتێ وی -ئەی پێغەمبەر- ژ وان دەنگ وباسێن بۆری یێن نەبەرچاڤن، ئەم بۆ تە ب وەحی دهنێرین، نە تە ونە مللەتێ تە بەری ڤێ چەندێ ئەو نەدزانی، ڤێجا بێهنا خۆ ل سەر نەخۆشی ودرەوکرنا مللەتێ خۆ فرەهـ بکە، وەکی پێغەمبەران بەری تە بێهنا خۆ فرەهکری، هندی دویماهییا باشە ل دنیایێ وئاخرەتێ بۆ وان تەقوادارانە یێن ژ خودێ دترسن.

{فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ غُرُوبِهَاۖ وَمِنۡ ءَانَآيِٕ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡ وَأَطۡرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرۡضَىٰ } [طه: ١٣٠]

ئانكو: ڤێجا تو -ئەی پێغەمبەر- بێهنا خۆ فرەهـ بکە ل سەر وان سالۆخەت ونەحەقییێن درەوپێکەر د دەر حەقا تە دا دبێژن، وتو د نڤێژا سپێدێ دا بەری هەلاتنا ڕۆژێ، و د نڤێژا ئێڤاری دا بەری



ئاڤابوونا ڕۆژێ، و د نڤێژا عەیشا دا ل شەڤێ، و د نڤێژا نیڤرۆ ومەغرەب دا ل ڕەخێن ڕۆژێ ب سوپاسییا خودایێ خۆ تەسبیحا وی بکە؛ دا ب وی ڕەنگێ تو ژێ ڕازی خێرا ڤان کریاران بۆ تە بێتەدان.

{فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ وَلَا يَسۡتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ } [الروم: ٦٠]

ئانکو: ڤێجا تو -ئەی پێغەمبەر- بێهنا خۆ ل سەر وێ نەخۆشییێ فرەهـ بکە یا ژ مللەتێ تە دگەهتە تە، هندی ئەو سۆزە یا خودێ دایە تە کو تە ب سەربێخت وخێرێ بدەتە تە ڕاستییە وچو گومان تێدا نینە، وئەوێن باوەرییێ ب ئاخرەتێ نەئینن بلا سڤکییێ و دودلییێ بۆ تە چێ نەکەن.

{فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ} [غافر : ٥٥]

ئانکو: ڤێجا تو -ئەی پێغەمبەر- صەبرێ ل سەر نەخۆشییا بوتپەرێسان بکێشە؛ چونکی مە سۆزا دایە تە کو پەیڤا تە بلند بکەین، وسۆزا مە هەر دێ ب جهـ ئێت، وتو داخوازا ژێبرنا گونەهان بۆ خۆ بکە، وبەردەوام ل سەر تەسبیح وپاککرنا خودایێ خۆ ل سپێدە وئێڤاران بمینە.



{فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۚ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعۡضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمۡ أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيۡنَا يُرۡجَعُونَ} [غافر:٧٧]

ڤێجا تو صەبرێ بکێشە، وبەردەوامییێ ل سەر ڕێکا خۆ بکە، هندی سۆزا خودێیە حەقییە، وئـــەو دێ سۆزا خۆ بۆ تە ب جهـ ئینت، ڤێجا یان هێشتا تو یێ ساخ ئەم دێ هندەکێ ژ وێ عەزابێ یا ئەم ژڤانی پێ ددەینە کافران نیشا تە دەین، یان ژی ئەم دێ تە مرینیـن، بەری ئەو عەزاب ب سەرێ وان بێت، ڤێجا زڤڕینا وان ل ڕۆژا قیامەتێ بۆ نك مەیە، وئەم دێ عەزابەکا دژوار سەرا کوفرا وان دەینێ.

{فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ ٱلۡغُرُوبِ} [ق : ٣٩]

ئانکو: ڤێجا تو -ئەی پێغەمبەر- بێهنا خۆ ل سەر وێ گۆتنێ فرەهـ بکە یا درەوپێکەر دبێژن، هندی خودێیە ل بەر وان دانایە، وتـــو سپێدێ بـــەری ڕۆژ بهەلێت، وئێڤاری بەری ڕۆژ ئاڤاببت.

{فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ} [القلم: ٤٨]

ئانکو: ڤێجا تو -ئەی پێغەمبەر- بێهنا خۆ فرەهـ بکە، وتو د لەزێ وکەربێ دا وەکی خودانێ نەهنگی نەبە، کو یوونس بوو، دەمێ



ئـــەو يێ تژی کەرب وی گازی خودایێ خـــۆ کـری کو لەزێ د عەزابدانا وان دا بکەت.

{وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ} [المدثر:٧]

وتو صەبرێ ل سەر وی تشتی بکە یێ خودێ پێ ژ تە ڕازی ببت.

{فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعۡ مِنۡهُمۡ ءَاثِمًا أَوۡ كَفُورًا } [الانسان:٢٤]

ڤێجا تو صەبرێ ل سەر حوکمێ خودایێ خۆ بکێشە، وبەردەوامییێ ل سەر بکە، وتو گوهدارییا وان بوتپەرێسان نەکە یێن د دلچوون وکوفرێ دا نقۆبووین.

{وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٖ كَذِبٖۚ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ } [يوسف:١٨]

ووان کراسێ وی ئینا وخوینەکا ژ درەو ونە یا یووسفی تێدا بوو؛ دا ئەو وی بۆ خۆ بکەنە شاهد ل سەر ڕاستییا خۆ، بەلێ ئەو بۆ دەلیلێ درەوا وان؛ چونکی کراس یێ ساخلەم بوو ونەهاتبوو دڕاندن. ئینا بابێ وان یەعقووبی گۆت: مەسەلە یا وەسا نینە وەکی هوین دبێژن، بەلکی نەفسێن هەوە یێن خڕاب کارەکێ کرێت د دەر حەقا یووسفی دا ب هەوە یێ دایەکرن، وئەو کار ل بەر هەوە یێ شرینکری ویا ژ هەوە ڤە کارەکێ باشە، ڤێجا صەبرکێشانا من دێ



یا جوان بت وئەز گازندا خۆ بۆ چو مرۆڤان ناکەم، ودێ داخوازا هاریکارییێ ژ خودێ کەم ل سەر وی تشتێ هوین ژ درەو سالۆخ ددەن.

{قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ فَصَبۡرٞ جَمِيلٌۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَنِي بِهِمۡ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ} [يوسف:٨٣]

وی گۆتە وان: نە وەسایە، بەلکی نەفسێن هەوە بێن خڕاب پیلانەك ل بەر هەوە یا شرینکری، وهەوە ئەو یا کری وەکی هەوە بەرێ د گەل یووسفی کری، ڤێجا صەبرکێشانا من دێ یا جوان بت ئەز گازندێ د گەل ناکەم، بەلکی خودێ هەر سێ کوڕێن من -یووسفی وبـــرایـــێ وی وبـــرایـــێ وان یـــێ مەزن ئەوێ ژ بەر برایێ خۆ مایی- بۆ من بزڤرینتە ڤە، هندی ئەوە ئەو ب حالێ من یێ پڕزانایە، و د کارێ خۆ دا یێ کاربنەجهە.

{قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُۖ قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِيۖ قَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَآۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ} [يوسف:٩٠]

وان گۆت: ئەرێ نەکو تو یووسفی؟ وی گۆت: بەلێ ئەز یووسفم، وئەڤە برایێ منە، ب ڕاستی خودێ قەنجی ومنەت ل مە کر، کو پشتی ژێکڤەبوونێ ئەم گەهاندینە ئێك، هندی ئەوە یێ تەقوایا



خودێ بکەت، وبێنا خۆ ل سەر تەنگاڤییان فرەهـ بکەت، خودێ خێرا قەنجییا وی بەرزە ناکەت، بەلکی ب باشترین ڕەنگ جزایی ددەتە وی.

{سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ} [الرعد: ٢٤]

ئانکو: ملیاکەت دبێژنە وان: ژ بەر صەبرا هەوە کێشای ل سەر گوهدارییا خودێ هوین ژ هەر نەخۆشییەکێ ب سلامەتی بن، ڤێجا بەحەشت چ خۆش خانییێ دویماهییێیە.

{وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦۖ وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ}[النحل: ١٢٦]

وئەگەر هەوە -گەلی خودان باوەران- ڤیا تۆلێ ژ وی بستینن یێ تەعدایی ل هەوە کری، هوین ژ وێ زێدەتر نەکەن یا وی د گەل هەوە کری، وئەگەر هوین صەبرێ بکێشن ئەو بۆ سەرکەفتنا د دنیایێ دا وبۆ خێرا مەزنا ل ئاخرەتێ بۆ هەوە چێترە.

{وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنۡ أَخۡرِجۡ قَوۡمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرۡهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ} [ابراهيم:٥]



و ب ڕاستی مه مووسا بۆ ئسرائیلییان هنارت ومه ب وان موعجزەیێن ڕاستییا وی ئاشکەرا دکەن پشتەڤانییا وی کر، ومه فەرمان ل وی کر کو ئەو بەرێ وان بدەته باوەرییێ؛ دا ئەو وان ژ بەرزەبوونێ دەربێخته هیدایەتێ، وبیرا وان ل قەنجییێن خودێ وبەلاییێن وی بینتەڤە، هندی د ڤێ بیرئینانێ دایه نیشان هەنه بۆ هەر ئێکێ د نەخۆشی وتەنگاڤییێ دا گەلەك بێهنا خۆ فرەهـ بکەت، وگەلەك شوکرێ ل سەر قەنجی وبەرفرەهییێ بکەت، و ب تایبەتی بەحسێ ڤان هاتەکرن؛ چونکی ئەون یێن وجێ بۆ خۆ ژ ئایەتان دبینن، وخۆ ژێ بێ ئاگەهـ ناکەن.

{أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱلۡفُلۡكَ تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ بِنِعۡمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنۡ ءَايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ} [لقمان : ٣١]

ئانکو: ئەرێ ما تە -ئەی بینەر- نەدیتییە کو گەمی د دەریایێ دا ب فەرمانا خودێ ب ڕێڤه دچن، ئەڤه قەنجییەکه وی د گەل هەوە کری؛ دا ئەو وێ ژ ئایەت ودەلیلێن خۆ نیشا هەوە بدەت یا هوین عیبرەتێ بۆ خۆ ژێ بگرن؟ هندی د چوونا گەمییێ دا د دەریایێ دایە ئایەت بۆ وی هەنه یێ گەلەك صەبرێ ل سەر ئەمرێ خودێ دکێشت، وگەلەك شوکرا قەنجییێن وی دکەت.



{فَقَالُواْ رَبَّنَا بَٰعِدۡ بَيۡنَ أَسۡفَارِنَا وَظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَحَادِيثَ وَمَزَّقۡنَٰهُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ} [سبأ: ١٩]

ئانكو: ڤێجا ژ بەر سەرداچوونا وان، ئەو ژ رحەتییێ وتەناهییێ تێر بوون ووان گۆت: خودایێ مە تو باژێرێن مە ژێك دویر بكە؛ دا سەفەرا مە د ناڤبەرا وان دا دویر ببت، وئەم چو گوندێن ئاڤا د رێكا خۆ دا نەبینین، ووان ب كوفرا خۆ زۆرداری ل خۆ كر ڤێجا مە ئەو تێبرن، ومە ئەو كرنە عیبرەت وسوحبەت بۆ وان یێن ب دویڤ وان دا هاتین، ومە ئەو باش پارچە پارچە كرن ووەلاتێ وان خراب كر، هندی د وێ دایە یا ب سەر {سەبەئێ} دا هاتی عیبرەتەك هەیە بۆ هەر ئێكێ گەلەك صەبرێ بكێشت، وگەلەك شوكرێ بكەت.

{إِن يَشَأۡ يُسۡكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظۡلَلۡنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٍ} [الشورى:٣٣]

ئـەو خودایێ ئەڤ گەمییە د دەریایێ دا هاژۆتین ئەگەر بڤێت دێ بای راوەستینت، ڤێجا ئەو گەمی ل سەر پشتا دەریایێ دێ راوەستایی مینن ونەشێن ب رێڤە بچن، د چوون وراوەستیانا ڤان گەمییان دا ئایەت وهێجەتێن ئاشكەرا بۆ هەر ئێكێ گەلەك بێهنفرەهـ ویێ گەلەك شوكردار هەنە.



{وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنَا سُبُلَنَاۚ وَلَنَصۡبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيۡتُمُونَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ } [ابراهيم: ١٢]

ئانكو: وچاوا ئەم خۆ نەهێلینە ب هیڤیيا خودێ ڤە، وئەوە یێ بەرێ مە دایە ڕێکا ڕزگاربوونا ژ عەزابا وی کو مە دویکەفتنا ئەحکامێن دینێ وی کری؟ وئەم دێ بێهنا خۆ ل سەر وێ نەخۆشییێ فرەهـ کەین یا هوین دگەهیننە مە، وخودان باوەر د مەسەلا سەرکەفتنا خۆ وشکاندنا دژمنێ خۆ دا دڤێت خۆ بهێلنە ب هیڤیيا خودێ ب تنێ ڤە.

{وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعًا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا مِنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ قَالُواْ لَوۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيۡنَٰكُمۡۖ سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَجَزِعۡنَآ أَمۡ صَبَرۡنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٖ} [ابراهيم: ٢١]

ئانكو: وچێکری ژ گۆڕێن خۆ دەرکەفتن، وهەمی بۆ خودایێ ئێك و ب سەرڤەهاتی ئاشکەرابوون؛ دا ئەو حوکمی د ناڤبەرا وان دا بکەت، ڤێجا دویکەفتی دێ بێژنە سەرکێشێن خۆ: هندی ئەم بووین ئەم د دنیایێ دا دویکەفتییێن هەوە بووین، مە ب گۆتنا هەوە دکر، ئەرێ ڤێجا هوین -ئەڤرۆ- تشتەکی ژ عەزابا خودێ دێ ژ مە پاشڤەبەن وەکی هەوە سۆز ددا مە؟ سەرکێش دبێژن: ئەگەر



خودێ بەرێ مە دابا باوەرییێ ئەم ژی دا بەرێ هەوە دەینێ، بەلێ وی بەرێ مە نەدایێ، وئەم بەرزەکرین ڤێجا مە ژی هوین بەرزەکرن، ئەم وهوین د وەکی ئێکین چ هەدارا مە بێت یان نەئێت، مە چو جهێن ڕەڤێ نینن ئەم ژ عەزابێ برەڤینێ.

{إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنۡ ءَالِهَتِنَا لَوۡلَآ أَن صَبَرۡنَا عَلَيۡهَاۚ وَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ حِينَ يَرَوۡنَ ٱلۡعَذَابَ مَنۡ أَضَلُّ سَبِيلًا } [الفرقان: ٤٢]

ئانکو: نێزیك بوو ئەو ب ئەزمانێ خۆ یێ موکم بەرێ مە ژ پەرستنا صەنەمێن مە وەرگێڕت، ئەگەر مە خۆ ل سەر پەرستنا وان موکم نەکربا، وپاشی دەمێ ئەو وێ عەزابێ دبینن یا هێژای وان ئەو دێ زانن: کی ڕێ بەرزەترە ئەو یان موحەممەد.

{ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ} [النحل: ١١٠]

ئانکو: پاشی هندی خودایێ تەیە بۆ وان لاوازان یێن بوتپەرێسان ل {مەکەهێ} ئەو عەزابداین، حەتا وان ب سەرڤە ئەو گۆتی یا کافر پێ ژ وان ڕازی ببن، ودلێن وان ب باوەرییێ دئاڤابوون، ودەمێ وان ڕێکا خۆ دیتی ئەو مشەختبووینە (مەدینێ)، پاشی وان جیهاد د ڕێکا خودێ دا کری، وصەبر ل سەر نەخۆشییێ کێشای، هندی



خودایێ تەیە -پشتی تۆبەکرنا وان- باش گونەهـ ژێبرە بۆ وان، وییێ دلۆڤانکارە ب وان.

{وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ } [النحل: ١٢٦]

ئانكو: وئەگەر هەوە -گەلی خودان باوەران- ڤیا تۆلێ ژ وی بستینن یێ تەعدایی ل هەوە کری، هوین ژ وێ زێدەتر نەکەن یا وی د گەل هەوە کری، وئەگەر هوین صەبرێ بکێشن ئەو بۆ سەرکەفتنا د دنیایێ دا وبۆ خێرا مەزنا ل ئاخرەتێ بۆ هەوە چێترە.

{وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ} [النحل:١٢٧]

وتو -ئەی پێغەمبەر- بێنا خۆ فرەهـ بکە ل سەر وێ نەخۆشییا د رێکا خودێ دا دگەهتە تە حەتا خۆشی دگەهتە تە، وبێنفرەهییا تە ب تنێ ب خودێیە، ئەوە یێ هاریکاری وپشتەڤانییا تە دکەت، وتو ل سەر وی ب خەم نەکەڤە یێ گوهدارییا تە نەکەت و د گازییا تە نەئێت، وتو ژ فەند وفێلێن وان بێن تەنگ نەبە.

{وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْۗ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًاۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ} [ص: ٤٤]



ئانكو: ومه گۆته وی: تو قەفتەكا داڤێن گیایی د دەستێ خۆ بگرە، وپێ بدانە ژنكا خۆ دا سویندا تە نەشكێت؛ چونكی وی سویند خواربوو ئەو دێ سەد جەلدان دانتە وێ ژ بەر خەلەتییەكا وێ كری. هندی ئەمین مە ئەیییووب بێهنفرەهـ دیت، چ باش بەنییە ئەو، هندی ئەوە ئەو گەلەك ل ئەمرێ خودایێ خۆ دزڤڕی.

{فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ وَلَا يَسۡتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ } [الروم: ٦٠]

ئانكو: ڤێجا تو -ئەی پێغەمبەر- بێهنا خۆ ل سەر وێ نەخۆشییێ فرەهـ بكە یا ژ مللەتێ تە دگەهتە تە، هندی ئەو سۆزە یا خودێ دایە تە كو تە ب سەربێخت وخێرێ بدەتە تە ڕاستییە وچو گومان تێدا نینە، وئەوێن باوەرییێ ب ئاخرەتێ نەئینن بلا سڤكییێ و دودلییێ بۆ تە چێ نەكەن.

{وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَاۖ لَا نَسۡـَٔلُكَ رِزۡقٗاۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكَۗ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلتَّقۡوَىٰ} [طه: ١٣٢]

ئانكو: وتو -ئەی پێغەمبەر- فەرمانا ب نڤێژێ ل مرۆڤێن خۆ بكە، وبێهنا خۆ ل سەر كرنا وێ فرەهـ بكە، ئەم پسیارا چو مالی ژ تە ناكەین، ئەمین ڕزقی ددەینە تە. ودویماهییا چاك د دنیایێ وئاخرەتێ دا بۆ خەلكێ تەقواییێیە.



{وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمۡ لَيَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشُونَ فِي ٱلۡأَسۡوَاقِۗ وَجَعَلۡنَا بَعۡضَكُمۡ لِبَعۡضٖ فِتۡنَةً أَتَصۡبِرُونَۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرٗا } [الفرقان:٢٠]

وبەری تە -ئەی پێغەمبەر- مە پێغەمبەرەکێ خۆ نەهنارتییە ئەگەر ئەو مرۆڤ نەبت، خوارنێ بخۆت، و ل بازاڕان بگەڕییێت. ومە هندەك ژ هەوە -گەلی مرۆڤان- بۆ هندەکان پێن کرینە فتنە وجەڕباندن، ب هیدایەتێ وسەرداچوونێ، وزەنگینی وفەقیرییێ، ب ساخی ونەساخییێ، کانێ هوین دێ صەبرێ کێشێن، ووێ کەن یا خودێ ل سەر هەوە واجب کری، وشوکرا وی کەن، دا ئەو خێرێ بدەتە هەوە، یان ژی هوین صەبرێ ناکێشن، ودێ خۆ هێژای جزادانێ کەن؟ وخودایێ تە -ئەی پێغەمبەر- بینەر بوویە ب وی یێ صەبرێ بکێشت ویێ نەکێشت، و ب وی یێ کافر ببت یان شوکرێ بکەت.

{وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗاۚ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ} [القصص: ٨٠]

ئانكو: وئەوێن زانین ب شریعەتێ خودێ بۆ هاتییەدان وڕاستییا تشتان زانی گۆتە وان یێن گۆتین: خوزی ئەوا بۆ قاروونی هاتییەدان بۆ مە ژی هاتبا دان: تێچوون بۆ هەوە بت تەقوایا



خودێ بکەن وگوهدارییا وی بکەن، خێرا خودێ بۆ وی یێ باوەری ب وی وپێغەمبەرێ وی ئینای، وچاکی کرین، چێترە ژ وێ یا بۆ قاروونی هاتییەدان، و ب تنێ ئەو گوهدارییا ڤێ شیرەتێ دکەت وکاری پێ دکەت یێ جیهادا نەفسا خۆ کری، وصەبر ل سەر گوهدارییا خودایێ خۆ کێشای، وخۆ ژ بێ ئەمرییا وی دایە پاش.

خودێ مزگینیێ ددەتە بەندەیێ خویێ باوەردار و صەبر کێش بڤێ ئایەتێ{قُلۡ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٞۗ وَأَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجۡرَهُم بِغَيۡرِ حِسَابٖ} [الزمر:١٠]

تو -ئەی پێغەمبەر- بێژە بەنییێن من یێن باوەری ب خودێ وپێغەمبەرێ وی هەی: هوین تەقوایا خودایێ خۆ بکەن وگوهدارییا وی بکەن. بۆ ئەوێن د ڤێ دنیایێ دا ب باشی پەرستنا خودایێ خۆ کری باشییەك ل ئاخرەتێ -کو بەحەشتە- وباشییەك ل دنیایێ ژی -کو سەرکەفتنە- هەیە. وعەردێ خودێ یێ بەرفرەهە، ڤێجا هوین تێدا مشەخت ببنە وی جهی یێ هوین بشێن پەرستنا خودایێ خۆ لێ بکەن، ودینێ وی ب کار بینن. ل ئاخرەتێ خێرەکا بێ حسێب بۆ وان یێن صەبرێ دکێشن دێ ئێتەدان.



{ٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلۡأَيۡدِۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ} [ص:١٧]

تو -ئەی پێغەمبەر- بێهنا خۆ ل سەر گۆتنا وان یا بۆ تە نەخۆش فرەهـ بکە، وتو بەحسێ بەنییێ مە داوودی بکە ئەوێ خودان هێز ل سەر دژمنێن خودێ ویێ صەبرکێش ل سەر گوهدارییا خودێ، هندی ئەوە وی گەلەك تۆبە دکر و ل وی تشتی دزڤڕی یێ خودێ ژێ ڕازی. و د ڤێ چەندێ دا صەبرئینانەك بۆ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن هەیە.



# ل دوماهیێ:

دل ب تنێ ب گۆتنا خودێ تەنا دبن و مە هیڤی هەیە ئەو تەناهیێ بکەتە ددلێ مە دا و ل صەبرا مە زێدە بکەت، چنکو ب ڕاستی خەلاتێ ب صەبر کێشانێ فە تێت ئەم هندی عەمەلی بکەین دبیت نەهێت بەرانبەر خەلاتێ صەبر کێشانێ، صەبرا ل سەر بجهـ ئینانا فەرماناخودێ و پێغەمبەری د زەمانەکێ دا دین تێدا گەلەک غەریب بووی، صەبرا ل سەر نەساخیەکێ هەتا خودێ ساخلەمی لمە زڤراندی و ئەڤ ئەزمون بسەرکەڤتیانە دەربازبووی، صەبرا ل سەر هەژارییێ، صەبرا ل سەر ژدەست دانا خوشتڤیا، صەبرا ل سەر زاڵما، صەبرا ل سەر بێ دەستهەلاتیا تە بەرانبەر وان کەسێت لبەرانبەری تە، صەبرا ل سەر درەنگ بجهـ هاتنا هیڤییا، صەبرا ل سەر ڕێکا سەرکەڤتنێ، صەبرا ل سەر کەڤتنێ و شکەستنا، صەبرا ل سەر درەنگ بەرسڤدانا دوعایا، تو بزانە ئەڤ دونیا مولکێ خودێ یە دان و نەدان ژوی نە و ب ئەمرێ وینە و هەمی ئەزموونە ئەم تێدا، خۆزیین وی یێ بسەرکەفیت و خەلاتێت خودێ بدەست خۆ ڤەبینیت، نەخۆزیین وی یێ شکەستنێ بینیت و خۆزیا بۆ ساخبوون و زڤرینا د دونیایێ دا بخوازیت، بژی و ڕازیبە بۆ وێ قەدەرا خودێ بووتە دای و



صەبری بکێشە خودێ ل ڕوژا قیامەتێ شەرم ژ عەبدێ خۆ دکەت ئەو عەبدێ د دونیایێ دا نەخوشی داینێ خودێ شەرم دکەت ل ئاخرەتێ نەخوشیا بدەتێ و وی ل دونیایێ هندە صەبر کێشای، بژی بوو رازیکرناخودایێ خۆ نەفسا مە رازی نابیت هندی هەبیت و هندی خوشا ببینیت پتر دخوازیت ئەڤجا دەست ژ رازی کرنا نەفساخوبەردە و دەست ب وی کاری بکە یێ خودێ پێ ژتە رازی دبیت.



و الحمد لله رب العالمين

و صلى الله وسلم على نبينا محمد

و على آله وصحبه أجمعين



# ناڤەڕۆک

